# گوڵە مۆرەکان

چیرۆک بۆ منداڵان

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە
عەبدوڵا سلێمان(مەشخەڵ)

ساڵی چاپ – 2006



ناوی کتێب: گوڵە مۆرەکان
بابەت: چیرۆک
و: عەبدوڵا سلێمان (مەشخەڵ)
نەخشەسازیی: ئەنجام سەعید
بەرگ: پەروەر
لە بڵاوکراوەکانی لقی کەرکوکی یەکێتی نوسەرانی کورد – 66
سەرپەرشتی چاپ: حەمە سەعید زەنگنە
چاپخانەی ئارابخا – کەرکوک
ساڵی چاپ – 2006







پێشکەشە بە:-

هەموو منداڵانی دڵ پڕ لە کەسەری کوردستان بەتایبەتی منداڵانی هەڵەبجەی لە گازدا خنکاو و منداڵانی گەرمیانی ئەنفال لە گەروو گیر بوو زۆر بە تایبەتیش پێشکەشە بە منداڵانی شارە بێنازەکەم – کەرکوک –تایبەتیریش پێشکەشە بە منداڵانی نێو قوڕ و لیتاوی ڕەحیماوە



چرپۆکەیەک

ساڵی پار لەسەر داوای ڕێکخراوی (چاک) دەستم کرد بە وەرگێڕانی چەند چیرۆکێکی منداڵان کە بە نیاز بوون لە ساڵیادی ژەهر ڕژێنەکەی هەڵەبجەدا لەگەڵ چەند چیرۆکێکی تردا بکرێنە کتێب و بە خۆڕایی بەسەر منداڵانی هەڵەبجە و گەرمیاندا بڵاو بکرێنەوە. .ئێستاش ئەم نامیلکەیەی بەردەستتان هەر ئەو چیرۆکانەن کە وەرم گێڕابوون و لە ڕاستیشدا حەوت نامیلکەی بچکۆلانەی مناڵانن و لە کتێبێکدا کۆمکردونەتەوە. ئەندێشەیەک کە لە پشت وەرگێڕانی ئەم چیرۆکانەوە هەیە ئەوەیە کە لایەنی فێر بوون و متمانە بە خۆبوون قورسایی خستۆتە سەر مەغزای چیرۆکەکان دیارە ئەمەش







هاندەرێکی بەهێزی من بوو کە تا وانەکانی نێو ئەم چیرۆکانە بخرێنە بەردەستی منداڵانی کورد. لەلایەکی تریشەوە با لەم دەرفەتەدا ئەوە بڵێم کە خۆشحاڵم بۆ یەکەمین جار هەوڵ دەدەم خزمەتێک بە منداڵانی کورد بە گشتی و منداڵانی شارە بێناز و بێکەسەکەم – کەرکوک – (بەتایبەتی) بکەم کە 31 ساڵی ژیانم لە نێو خۆڵ و چڵپاوەکانیدا بەسەر بردووە.  تکا لە منداڵانی ئازیزیش دەکەم کە ئەم هەوڵەم وەک وەفایەک بۆ سەردەمی منداڵیم و وەکو خۆشەویستییەک لێ قەبووڵ بکەن.

عەبدوڵا سلێمان(مەشخەڵ)
ڤانکۆڤەر/کەنەدا
3ی مارسی 2006





# کۆواڵەیەکی ئازا



نوسینی/ڕێبێکا جونسۆن

کۆواڵەیەکی بچکۆلانە حەزی لە گەڕان و چوونە دەرەوە بوو.حەزی دەکرد بەسەر پشتی دایکیەوە گەشتی دوور و درێژ بکات



بۆ گەڕان و سۆراخی گەڵای بەتام و بینینی کۆواڵەی تر.

ڕۆژێکیان کۆواڵە بچکۆلەکە لە دایکی پرسی((دایکە،ئایا ئەتوانین بچین بۆ گەشت و گەڕان ؟))

دایکی وەڵامی دایەوە((ئۆە کۆواڵە بچکۆلەکەم ئەمڕۆ زۆر گەرمە))

کۆواڵە بچکۆلەکە وتی((باشە..من ئێستا گەورەم و ئازام...بەتەنها ئەڕۆم))

دایکی گوتی ((ئا ئەوها.. باشە بڕۆ))

کۆواڵەکە ڕۆیشت و زۆر بەوریاییەوە لەدارەکە هاتە خوارەوە و مامی کۆواڵە بچکۆلەکەش لەدارێکی نزیکەوە لێی دەڕوانی و لێی پرسی((ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی کوڕە گەنجەکە؟))

کۆواڵە بچکۆلەکە بەشانازییەکەوە((من گەورە و ئازام،من بەتەنها گەشت ئەکەم))

مامەشی وتی((ئا...ئاوها....))

کۆواڵە بچکۆلەکە لەسەرەخۆ و زیاتر لەدارەکە هاتە خوارێ بەتەنیشت داپیرەیدا گوزەری کرد.

داپیرەی زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و گوتی ((ئۆە کۆواڵە ئازیزەکەم..بۆ کوێ دەڕۆی؟))
کۆواڵە بچکۆلەکە وەڵامی دایەوە((من ئێستا گەورە و ئازام. )) بەدەنگێکی بەرز ((من بەتەنها گەشت دەکەم)).
داپیرەی گوتی(( ئا...ئاوها...))
کاتێک گەیشتە خوارەوەی دارەکە ،بەخێرایی ڕای کرد بەرەو دارێکی تر و پیایدا هەڵگەڕا.
لەناکاو باپیری لێ پەیدا بوو و لێی پرسی((ئەوە بەتەنها بۆ کوێ دەڕۆی؟))
کۆواڵە بچکۆلەکەش وەڵامی دایەوەو وتی((وەک دەزانی من ئێستا گەورە و ئازام،من بەتەنها گەشت دەکەم)).
باپیرەشی وتی((ئا...ئاوها...))((ئەی ئەو مارە گەورەیەش لەگەڵ تۆدا گەشت دەکات؟))
کۆواڵە بچکۆلەکەش بەکاوەخۆ ڕوانییە سەرەوەو مارە گەورەکەی بینی کە ئەیفیشاند.
((فریام کەون !)) کۆواڵە بچکۆلەکە هاواری لێ هەڵسا وپێی لەلقی دارەکە هەڵخلیسکا.



کۆواڵە بچکۆلەکە بەپەلە و تاتوانی بەخێرایی هاتە خوارەوەی دارەکە گوتی((خوا حافیز باپیرە)) و چوو هەڵگژا یەوە بە دارەکەی خۆیان و گوتی((خوا حافیز داپیرە)) و بەهەناسەبڕکێ یەکی زۆرەوە بەدارەکەدا هەڵگەڕا بۆ سەر سەرەوەو لەئاست مامیداگوتی((خواحافیز مامە)) و تا گەیشتە سەر دارەکەو خۆی هەڵدایە سەر پشتی دایکی
دایکی لێی پرسی((بزانم زوو گەڕایتەوە؟))
کۆواڵە بچکۆلەکە گوتی((وەک دەزانی ئەمڕۆ زۆر گەرمە دایکە گیان)).

سەرچاوە/
Brave Koala
Story by Rebecca Johnson
Photo by Steve Parish
Printed in Australi 2003







## ماسيی یەکی گاڵتەباز ی زیرەک



نوسینی / ڕێبێکە جۆنسۆن



ئەم ماسییە گاڵتەبازە بچووکە تەواو هەستی بە عاجزی دەکرد،تەنها یەک هاوڕێی هەبوو ناوی ((ئەنێمۆنە)) بوو.

لەناو مووە ژەهراوییە پێوەنووساوەکانی ((ئەنێمۆنە))دا هەستی بە ئارامی ئەکرد.

هەروەها ((ئەنێمۆنە)) ش خۆشی دەویست وئەو خواردنانەشی پێ خۆش بوو کە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا.

ماسییەکی گاڵتەبازی تریش هەبوو لەو دەورو بەرە،هەندێ بەشی پرتەقاڵی و ،

هەروەها هێڵی شینی پێوە بوو.

ماسییەکی گاڵتەبازی تریش هەبوو ڕەنگی ڕەش بوو و کلکێکی بچووکی سپی پێوە بوو.

هەندێک لەو بڕوایەدا بوون کە لەوانەیە هونەرمەند پەڕەکانی ڕەنگ کردبێ.

بەڵام ماسییە گاڵتەبازەکە بەشوێن هاوڕێیەتی یەوە بوو ،بۆیە بڕیاری دا بۆ مەلەکردن بچێتە بەربەستە بەردینەکانی نێو دەریا.

ماسییەکە ماسییەکی ڕەنگ سیلڤەری بینی کە زۆر دەبریسکایەوە ،و ماسییەکی زۆر جوانی تری ئالآیی بینی کەپەڕێکی سپی درێژی هەبوو، هەروەها ماسییەکی تری زوڕنایی ڕەنگ زەردی بینی کە لووتێکی درێژی هەبوو ،بینی پەریە ماسی لەگەڵ گەورەبوونی مەرجانەکاندا سەما دەکەن،و هەروەها گەلێ ئەستێرە ماسی ڕەنگاوڕەنگی بینی کە دەیانتوانی ئاسمان ڕووناک بکەنەوە. چەند پەپوولە ماسییەکی تری بینی بەخلیسکانەوە بەتەنیشتییەوە ڕەتبوون و هەروەها ماسییە پاککەرەوەی بینی کە سەرقاڵی کاروباری خۆی بوو بۆ یارمەتیدانی ئەوانی تر بۆ ئەوەی جوانتر و گەشتر بنوێنن.

ئەو کات بەبیریدا هات گوزەران بەو شێوەیە بێمانایە و ئەمیش زۆر تەنیایە، ئەکات لەنێو ((ئەنێمۆنە))ەوە بەشەرمەوە ماسییەکە ووتی((سڵاو)) و لێدانی دڵیشی زیادی کرد.

جا ئەگەر تۆ بەوردی بڕوانی کاتێک لەنێو دەریادا مەلە ئەکەی ، لەوانەیە ئەو ماسییە



گاڵتەبازە وئەو خێزانە گەورەیە ی ماسییەکان ببینی.

سەرچاوە/

Clever Clownfish

Story by Rebecca Johnson

Photo by Steve Parish

Printed in Australia 2003







نەخشە دانان

مانگی ئابی 1914 بوو،((سێر ئەرنەست شاکڵێتۆن)) لەبەردەم کەوانەی پاپۆڕە دارینە بەهێزەکەی ((ئیندوراس)) ڕاوەستابوو.بیست و حەوت پیاو و شەست و نۆ سەگ لەنێو پاپۆڕەکەدا بوون.پاپۆڕەکە کەوتە ڕێ بەرەو جەمسەری باشور.

جەمسەری باشور کیشوەرێکە کەوتۆتە خوارووی گۆی زەوییەوە کە ساردترین جێگەی سەر ئەم زەوییە.هیچ ڕووەکێک لەو جێگەیە شین نابێت،تەنها چەند ئاژەڵێکی تێدا دەژێت.لە 1914 دا تەنها کەسانێک توانیبویان بگەنە ئەو شوێنە دۆزەرەوەکان بوون.

باشە بۆچی شاکڵێتۆن ئەیویست بچێت بۆ جەمسەری باشور؟

((شاکڵێتۆن ))خۆشی دۆزەرەوە بوو،ئەیویست تۆمارێکی نوێ تۆمار بکات – ئەیویست ببێت بەیەکەمین کەس کەجەمسەری باشوری لەمسەرەوە بۆ ئەوسەر بڕیبێ.بەڵام ئەو نەخشەیە بێبەری نەبوو لە گیروگرفت .

دەریا پڕ بوو لە پارچە بەفری گەورە،هەر ڕۆژە بەفرەکە ئەستورتر دەبوو’((ئیندوراس))یش بە هێواشی ئەو بەفرەی لادەدا.بەفر ترسناکە ،لەتوانایدا هەیە پاپۆڕەکە کون بکات. پاشان پلەی گەرما تا دەهات نزمتر دەبۆوە.بەفرەکانی دەوروبەری پاپۆڕەکە بەستبووی’.((ئیندۆراس)) نەیدەتوانی چیتر بچێتە پێش.نەیدەتوانی بسوڕێتەوە و بگەڕێتەوە بەرەو پاش.پیاوەکان هەوڵیان دا بەشکاندنی بەفرەکان ڕێگایەک بکەنەوە،و ((شاکڵێتۆن)) ش بێ هیوا نەبوو و فەرمانی تازەی دەرکرد.{چارۆکەکان هەڵبکەن! مەکینەکان پێبکەن!}و((ئیندۆراس))خێراییەکی زۆری درایێ لەنێو ئەو بەفرەدا.پاپۆڕەکە بە هیچ شێوەیەک نەیتوانی بجوڵێت ((شاکڵێتۆن)) و پیاوەکان کەوتنە نەخشەدانان.







((2))

## وازهێنان لە پاپۆڕ

پیاوەکان چاودێری دەریای بەفریان ئەکرد .نەیانتوانی کیشوەری جەمسەری باشور ببڕن،تەنانەت نەیانتوانی بگەنە ئەوێش.باشە ئێستا چییان بەسەر دێت؟

((شاکلێتۆن)) پێی وتن کە پیلانێکی تازەی هەیە ،دەبێت لەسەر ((ئیندۆراس)) بمێننەوە تا بەفرەکە دەشکێت ((دەتوێتەوە)) .پاپۆڕەکە خواردەمەنی زۆری تێدا پاشەکەوت کرابوو.ئەگەر گۆشتی تازەشیان بویستایە ئەو ((بەتریق))و((ماسیخۆرە))یان ڕاو دەکرد.پاشان کە ڕێگەی پاپۆڕەکەیان کرایەوە،ئەتوانن بەرەو ماڵ بڕۆنەوە.



بەڵام ((شاکلێتۆن)) دەیزانی کە مانگەکانی داهاتوو هەروا ئاسان نیە.بۆیە فەرمانی دا بە دارتاشی پاپۆڕەکە چەند ژوورێک لە گەرمترین جێگەی پاپۆڕەکە دروست بکات.تەنانەت سەگەکانیش ژووری نوێیان بۆ دروست کرا.

پیاوەکان بەم ژوورە بچوکانەی سەگەکانیان ئەوت((ماڵۆچکەی سەگ)).

سەگەکان مایەی دڵخۆشی ڕابواردن بوون.پیاوەکان یاریان لەگەڵ دەکردن و وەکو سەگی ماڵی((ماڵەوە)) بەرخوردیان پێ دەکردن.کاتێک یەکێک لە سەگەکان کە ناوی((ساڵیی))بوو و هاتە زاین کۆمەڵێ بەچکەی بوو.((تۆم کرین)) دووەم کاپتنی پاپۆڕەکە کوخێکی بچووکی بۆ دروست کردن تا تێیدا بحەوێنەوە.

هەندێک لە پیاوەکان چوون بۆ ڕاوکردنی((ماسیخۆرە)). کاپتنی پاپۆڕەکە ((فڕانک ۆرسلی)) سەردەکەوتە سەر گوریسی پاپۆڕەکە.((فرانک ۆرسلی)) چاوی زۆر تیژ بوو







،ئەگەر هەر ((ماسیخۆرە))یەکی ببینیایە ئەوا هێمای بۆ پیاوەکان دەکرد و ئەوانیش بەپەلە دەکەوتنە شوێنی ((ماسیخۆرەکە)) بۆ ڕاوکردنی.
پاش ماوەیەک شتێکی وا نەما خۆیانی پێوە سەرقاڵ بکەن.پیاوەکان بێزاربوون.((شاکلێتۆن))هەوڵی دەدا ئاسودەیان بکات،هەستا پیاوەکانی فێری گەمەی ((کارد))کرد، شیعری بۆ دەخوێندنەوە.
((شاکلێتۆن)) لەگەڵ هەموویاندا زۆر میهرەبان بوو. پیاوەکانیش تا دەهات ((شاکلێتۆن))یان زیاتر خۆشدەویست و لەخۆشەویستیا پێیان دەوت ((سەرۆک)).
سەرۆک دەستی کرد بەوتنی گۆرانی نوکتە وگەمە ومەتەڵ و نواندن و نمایشی خلیسکان لەسەر بەفر .شەوێکیان پیاوەکان جلوبەرگی سەیریان لەبەرکردوو نمایشیان کرد.
لەدەرەوەش کەوتنە یاری فوتبۆڵی بەفری و هۆکی.پێشبڕێیان دەکرد لەنێوان تیمەکانی سەگەکان،بەمەشیان دەوت((پێشبڕکێی مەزنی



سەگەکانی جەمسەری باشور)) پیاوەکان هاواریان دەکرد و هانیان دەدان و سەگەکانیش وەک بروسکە ڕایان دەکرد بەسەر ئەو بەفرەدا.
بەڵام هەر زوو دیسانەوە دوودڵیەکەیان دەستی پێکردەوە.ئەوا حەوت مانگە لەلایەن بەفرەوە گەمارۆ دراون و پاپۆڕەکەش هەر لەجێگەی خۆی چەقیوە.تازە کەش و هەواش زۆر خراپتر بووە.
زریانی توند دەستی پێکردووە،پیاوەکان گوێیان لێبوو لە نزیکەوە بەفرەکە دەهاژێنێ و دەگڤێنێ پارچە بەفرەکان زۆر بە توندی پاڵەپەستۆیان دەخستە سەر یەکتر بەجۆرێک کە هەر لایەی بەرزبۆوە بۆ سەرەوە.
(( کاپتن .. پاپۆڕەکە ناتوانێت بەم شێوەیە بمێنێتەوە))((شاکلێتۆن)) بە((فرانک ۆرسلی))ووت. ((تەنها گرفت کاتە... ئەوەی بەفر بیهێنێت ،بەفر هەڵیدەگرێت)).
((شاکلێتۆن)) ڕاستی دەکرد.بەفرەکە ((ئیندوراس))ی توند وتوندتر دەگوشی







لەڕۆژێکی ترسناکدا پاپۆڕەکە بەلادا هات وچەند کاتژمێرێک دواتر پاپۆڕەکە ڕاست بۆوەو و چیتر پیاوەکان هەستیان بە سەلامەتی نەدەکرد.بەچواردەوریانەوە بەفرەکە دەهەژا ودەلەرزا.((ئیندوراس))کونی تێ بوو و هەموو کاریان دەکرد ئاوەکە فڕێ بدەنە دەرەوە.هەندێک لە پیاوەکان بازیان دایە سەر بەفرەکەو بە خاکەناس و تەور کەوتنە بڕینی بەفرەکە،بەڵام هیچ سودی نەبووچونکە بەفرەکە زۆر ئەستور بوو بەکەڵکی ڕنین نەدەهات.

پاشان پارچە بەفرێکی گەورە کونێکی لە تەنیشتی پاپۆڕەکەوە کرد وئاو ڕژایە ناوەوە.((ئیندوراس))خەریک بوو دەشکا و بەرەو نقووم بوون دەچوو.((شاکلێتۆن)) بە ماتی یەکەوە فەرمانی دا((واز لەپاپۆڕەکە بهێنن)).



((3))

لەسەر بەفر

ئەو کۆمەڵە بچووکە لەپیاوان لەسەر بەفرێکی تەڕ وەستابوون.سندوق و جانتا لەژێر پێیاندا کۆمەڵ ببوو.((شاکلێتۆن)) جەختی لەسەر پاراستنی خواردن و کەلوپەل و چادر و بەلەمەکان دەکرد لە((ئیندوراس)) ،خێوەتگایەکیان دروست کرد.

زریان بەسەر بەفرەکەدا دەیگڤاند،و ((شاکلێتۆن))ش دوودڵ بوو،بەڵام دەرینەدەبڕی، خۆی هێمن و دڵخۆش نیشان دەدا((پاپۆڕە و کۆگاکان فەوتان)) ئینجا وتی ((ئێستا ئەڕۆینەوە بۆ ماڵ)).

((شاکلێتۆن)) پیلانێکی تری ئامادە کردبوو.دەبێت لەو بەفرە بپەڕنەوە و بەهۆی







بەلەمەکانیانەوە بڕۆن بۆ ((دورگەی پاولێت)) کەزۆر دوور نەبوو و کەلوپەلێکی زۆریان لەوێ حەشاردابوو.
سەرۆک کیسەی خەوەکانی دەرهێنا کەلە پێستی ئاسک دروست کرابوو. بەڵام تەنها هەژدە کیسەیان هەبوو.هەندێک لە پیاوەکان هەر بەبەتانی سادەیان بەکاردەهێنا. ((شاکلێتۆن)) یانسیبی دانابوو بۆ کیسە گەرمەکان.خۆی هیچی نەدەبرد،تەنها بەتانیەکی بۆ خۆی هەڵدەبژارد. تەنانەت بووتە ئەستورەکانی خۆشی دەدایە ئەوانەی کە بووتەکانیان بێکەڵک و دڕابوون.
پیاوەکان گالیسکە و بەلەمەکانیان ئامادە کرد. پاشان((شاکلێتۆن)) فەرمانی دا و دەستیان کرد بە پەڕینەوە لە بەفرەکە. سەگەکان گالیسکەکانیان ڕادەکێشا و پیاوەکانیش بەلەمەکانیان بەدوای خۆیاندا کێش دەکرد.بەڵام زۆر سەخت بوو ڕۆیشتن بەسەر بەفری زبر و نوک تیژ.پیاوەکان و سەگەکانیش هەر دەکەوتن و هەڵدەخلیسکان.لەکۆتایی ڕۆژەکە کەکەمتر لە دوو میلیان مابوو هەرهەموویان زۆر ماندوو ببوون،سەرۆک بینی کەوا پیلانەکەی باش کار ناکات،فەرمانی نوێی دەرکرد بۆ دروست کردنی خێوەتگایەک لەسەر پارچە بەفرێکی زۆر گەورەی سەر ئاو کەوتوو.جا ئەگەر بەخت یاریان بێت ئەوا با و تەوژمی ئۆقیانوس نزیکیان دەخاتەوە لە ((دورگەی پاولێت)).بەخت یاریان نەبوو وپێنج مانگ دواتر هەر لەسەر پارچە بەفرەکە هەڵیان دابوو.هەروەها تەنانەت زیاتر دووردەکەوتنەوە لە ((دورگەی پاولێت)).
خواردن تا دەهات کەمتر دەبۆوە.هەندێک لە پیاوەکان لاواز ببوون بەهۆی برسێتی یەوە . لە ڕۆژێکی زۆر ناخۆشدا خواردن نەمابۆوە تا بدرێت بە سەگەکان و ئەوانیش برسێتی تەنگی پێهەڵچنیبوون و یەکە یەکە پیاوەکان سەگەکانیان دەکوشت.زۆر ناخۆش بوو. ((فرانک هێرلی)) لە یاداشتەکانیدا دەنوسێت((من بە دڵێکی بریندارەوە وتم ماڵئاوا)).







پارچە بەفرە گەورەکە بەرەو ئاوی گەرمتر ڕادەماڵدرا. پیاوەکان هەستیان کرد کە شتێکی خراپ بەڕێوەیە ڕوودەدات. بەفرەکە دەتوایەوە!.بەفری ژێر خێوەتگاکەیان دەستی کرد بەهەژان وبەرزبوونەوە. پارچە بەفرەکە گەورەکەکەوتە هەرەسهێنان.

((شاکڵێتۆن)) فەرمانی دا بەلەمەکانیان وەگەڕخەن هەر زوو کەوتنە هەڵبەزە و دابەزە لە نێو دەریایەکی ساردو گەورەدا.

((4))

ئۆقیانوسێکی بەرین

پیاوەکان دەستیان کرد بە سەوڵ لێدان.دونیا زۆر سارد بوو.شەپۆلێکی گەورەی بەفر کەوت



بەسەریاندا و ئاوی بەستووی ڕژاند بەسەری جلوبەرگیاندا،((شاکڵێتۆن)) تەماشای نەخشەکەی کرد ،نزیکترین زەوی ((دورگەی ئەلەفانت))بوو. دورگەیەکی زۆر بچووک بوو،بەڵام دوا دەرفەتیان بوو. ئەگەر نەیدۆزنەوە،ئەوا ڕادەماڵدرێنە ناو قوڵایی ئۆقیانوسەوە.

هەر شەوە بەلەمەکانیان بە پارچە بەفرێکی گەورەوە لەنگەر پێدەگرت وپاشان چادرەکانیان هەڵدەدا و لەسەر بەفرەکە دەنوستن. یەکەمین شەو ((شاکڵێتۆن)) نەیتوانی بنوێت، هەڵسا و کەوتە سوڕانەوە لەنێو چادرگا بچووکەکەیان. لەناکاودا درزێک

کەوتە بەفری ژێر چادرێک و ئەویش بەپەلە ڕای کرد بەرەو شوێنی ڕوداوەکە.یەکێک هاواری کرد((یەکێکمان دیار نیە)). یەکێک لە پیاوەکان لە درزی بەفرەکەوە کەوتبووە ناو ئەو ئاوە تەزیوەوە. ((شاکڵێتۆن))بەپەلەگەیشتە خوارێ و پیاوەکەی ڕزگار کرد.







پیاوەکان حەوت ڕۆژیان بەسەوڵێدان بەسەربردلەپێناو مانەوەیاندا.زۆر برسی و تینوو بوون.هەندێکیان توشی نەخۆشی دەریا بوون((بازنەی بەئازارە کە خاڵ لەسەر دەموچاو دەستیان پێک دەهێنێت)) هەروەها پێیە تەڕەکانیان سڕ ببوون. دەبوایە پەنچەکانیان بجولاندایەوە بۆ ئەوەی نەیبەستێ. پاشان دەستی بەبەفر بارین کرد.جلوبەرگەکانی بەریان بەستبووی. گەر بجولانایەتەوە ئێشیان پێدەگەیشت. زۆر بەقورسی هەڵدەلەرزین بۆیە زۆر بە زەحمەت دەیانتوانی بنوون.زۆرێک لە پیاوەکان بەتەواوەتی بێزار ببوون.

((شاکلێتۆن)) خۆی تۆزقاڵێک نوست،بەردەوام چاودێری هەر سێ بەلەمەکەی دەکردبۆ ئەوەی دڵنیا بێت کە بەلەمەکان لەژێر ئەو تۆفانی دەریایە بەیەکەوە دەمێننەوە. دەنگی کەوتبوو ((نوسابوو)لەئەنجامی هاوارکردن بۆ بەرز ڕاگرتنی وورەی پیاوەکان.



لەکۆتاییدا تارمایی کەندەڵانە ڕەشەکەی ((دورگەی ئەلەفانت)) لەبەردەمیان پەیدا بوو.بەڵام لەکوێ لەنگەر بگرن ؟ کەندەڵانەکە ڕێک هاتبوە خوارەوە بۆ ناو دەریا.بایەکی بەهێزیش دەستی کرد بەپاڵنانی بەلەمەکان بەرەو کەندەڵانەکە. لەوە دەچوو پەلەیان بێت بەرەو بەردەکان.

پاشان یەکێک لەنێو بەردەکاندا شوێنێکی کراوەی دۆزییەوە و ئینجا سەرکەوتنە سەری ،بەلەمەکانیش کەوتنە پشودان لە کەناری ئەو بەردە بلوریانەدا. ((شاکلێتۆن))و دەستەکەی کەوتنە سەر زەوی. زۆر ماندوو بوون تەڕ بوون و سەرمایان بوو. بەڵام هەرچۆنێک بێت زەوی ڕاستەقینە لەژێر پێیان بوو. نەئاو بوو،نەبەفر بوو.بەڵکە زەوی بوو!.







## ((5))

## زەوی

بەڵێ زەوی بوو.بەڵام ((شاکڵێتۆن)) و دەستەکەی هەرگیز لێرەدا ڕزگار نابن.چونکە هیچ پاپۆڕێک لە ((دورگەی ئەلەفانت)) لەنگەر ناکرێ.
سەرۆک دەبوایە بچێت بۆ یارمەتی بەدەست هێنان.لە دووری هەشت هەزار میل و بەپانتایی پڕ زریانترین ئۆقیانوس لە جیهان ئەویش ((دورگەی جۆرجیای باشور))بوو کە وێستگەی ڕاو کردنی نەهەنگی لێبوو. ((شاکڵێتۆن)) ئەیزانی کەئەو وێستگەیە بەردەوام خەڵکی لێ دەژێت.گەیشتن بەو شوێنە پڕ مەترسیەو لەوانەشە



مەحاڵ بێت،بەڵام تاکە دەرفەت ((شاکڵێتۆن))ە بۆ ڕزگارکردنی دەستەکەی.((شاکڵێتۆن)) هەمیشە نیگەران بوو سەبارەت بە دەستەکەی.جارێک خەونی بینیبوو کە یەکێک لە پیاوەکانی زامدار ببوو،لەخەو ڕاپەڕیبوو و هاواری کردبوو.بڕیاری دابوو بیانگێڕێتەوە بۆ ماڵ.
((شاکڵێتۆن)) بڕیاریدا بەهۆی گەورەترین بەلەمیەوە بڕوات بەرەو ((دورگەی جۆرجیای باشور)).پێنج کەسی هەڵبژارد تا لەگەڵی بڕۆن{کاپتن فرانک وۆرسلی،دووەم کاپتن تۆم کرین،دوو دەریاوانی بەهێز و هەروەها دارتاشەکەش کەتوانای چاککردنەوەی بەلەمەکانی هەیە کاتێک بەنێو دەریای دڕدا ڕێ دەکەن}.ئەگەر بتوانن بگەنە شوێنی مەبەست ،ئەوا ئەتوانن یارمەتی بەدەست بهێنن و ئەوانی تریش ڕزگار بکەن.
پیاوەکان ماڵئاواییان لە هاوڕێکانیان کرد و ئایا جارێکی تر یەکتر دەبیننەوە؟ کەس







نەیدەزانی.چارۆکەکەیان هەڵکرد و بایەکەش بەلەمەکەی ڕاماڵیە دوور.پیاوەکان بەنۆرە کاریان دەکرد.شەپۆڵێکی گەورەی سامناک بەلەمەکەی پڕ کرد لە ئاو،دوو پیاو ئاوی ناو بەلەمەکەیان دەردەهاویشت وەختێک پیاوەکەی تر بەلەمەکەی دەهاژوژت.سێ پیاوەکەی تریش لەژێرنهۆمی چارۆکەی بەلەمەکە درێژ ببوون کە دارتاشەکە دروستی کردبوون.کیسە خەوەکانیان خوسابوو.پێستی ئاسکەکەمووەکانی هەمووی لێببونەوە بەهۆی هەناسەدان و قوتدانی پیاوەکانەوە.دەیانویست بنوون،بەڵام باو بۆران وشەپۆڵ بەلەمە بچوکەکەیان سەرشێتانە دەهێناو دەبرد.

ڕۆژێکیان((شاکلێتۆن)) شەپۆڵێکی ئەژدیها ئاسای بینی کەبەرەو ڕوویان دەهات.ئەوەزۆر گەورەیە، هاواری کرد((ڕاوەستن))((ئەوە ئێمەی گرتەوە)). شەپۆڵەکە بەلەمەکەی پڕ لەئاو کرد.هەرهەموویان بەرقەوەکەوتنە خاڵی



کردنەوەی بەلەمەکە لەئاو.چونکە بەشێوەیەک لە شێوەکان سەرئاو کەوتبوون.

بەڕاستی گەشتێکی ناخۆش بوو.بەفرەکە ڕێگاکەو بەشی سەرەوەی بەلەمەکەی گرتبووقورسی کردبوو لەڕۆیشتندا.((شاکلێتۆن)) ئەترسا لەوەی نقوم ببن بۆیە فەرمانی دا بە پیاوەکان بەفرەکان ڕابماڵن تا ئەو شوێنەی دەستیان پێڕادەگات.پاش پازدە ڕۆژ یەکێک لەپیاوەکان هاواری کرد((زەوی هۆ)) .بەزەحمەت باوەڕیان دەکرد .لەپێشیانەوە بەفر لووتکەی ((دورگەی جۆرجیای باشور))ی داپۆشیبوو.

بەلام پێش ئەوەی بگەنە سەر زەویەکە گەردەلوولێک هەڵی کرد و دووری خستنەوە ،پاشان بەتوندا پاڵی پێوەنان بۆ پێشەوە بەرەو بەردەکانی کەنار.بایەکە تا دەهات زیادی دەکرد.شەپۆڵە سەرشێتەکان کەوتنە وێزەی بەلەمەکە و کڕێوە و تەزرەیەکی کوێرانە کارێکیان کرد کەبینینی بەردەمی خۆیان مەحاڵ بێت. ((شاکلێتۆن))کەدواتر نوسیبووی

((زۆربەمان لەوبڕوایەدا بووین کە کۆتاییمان زۆر نزیک بووە)). ((شاکلێتۆن)) و پیاوەکانی ئەو شەوە تاکو بەیانی لەململانێ دابوون لەدژی شەپۆڵ و باوبۆران.بۆ ڕۆژی دواتر گەردەلوولەکە تێپەڕی و پیاوە ماندوەکان کەوتنە ڕاکێش کردنی بەلەمە کۆن و لەکەڵک کەوتووەکەیان بەرەو کەنارێکی نزم.



((6))
لەسەر سەهۆڵە ڕووبار

((شاکلێتۆن)) چاوێکی بەدەوروبەردا گێڕا،بێجگە لە بەفر و سەهۆڵ و لووتکەی چیا هیچی تری نەدەبینی.وێستگەی ڕاوکردنی نەهەنگیش کەوتۆتە لایەکەی تری دورگەکەوە.بەلەمەکە تەواو تێکوپێک چووبوو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە.پیاوەکان دەبوایە ((دورگەی جۆرجیای باشور)) بە پێیان ببڕن. بەڵام سیانیان زۆر لاواز بوون بۆ ئەو گەشتە.{شاکلێتۆن و فرانک ۆرسلی و تۆم کرین} دەبێت خۆیان بەتەنها بڕۆن.

لەگەڵ ڕۆژبوونەوەدا دەستیان کرد بە هەڵگەڕان بە چیاکەدا ،کاتێک گەیشتنە سەر لوتکەی چیاکە بینیان هیچ ڕێگایەک نیە بۆ دابەزین بەرەو لایەکەی دی.چونکە زۆر لێژ بوو.گەڕانەوە و هەڵگەڕان بە ڕێگەیەکی تری شاخاوی ،پاشان







یەکێکی تر،هەموو جارێک وەکو یەک بوون.ئەگەر هەوڵ بدەن بڕۆنە خوارێ ئەوا دەکەونە نێو مەرگەوە.

ئەمجارە هەڵگەڕان بە چوارەمین ڕێگەی شاخاوییەوە،شەویش نزیک ببووەوە،جا ئەگەر بە زوویی نەچنە خوارێ ئەوا ڕەق دەبنەوە.سەرۆک ویستی ئەم دەرفەتەوەر بگرێت .لەبەردەمیاندا نشێوێکی زۆر درێژ و بەفراوی بوو،کەلەوانەیە بە سەلامەتی بیانگەیێنێتە خوارێ یان لەوانەیە لەکەندەڵانێک کۆتاییان پێ بێت.. زۆرلایان ڕوون نەبوو. ((شاکلێتۆن)) وتی ((کوڕینە.. ئەگەر نەڕۆینە خوارەوە پێویستە لەسەرمان لاڕێ بگرین پێش ئەوەی بگەینە ڕاستەڕێ ((چ بکرێت باشە؟))

پیاوەکان وەڵامیان داوە{لێژاییەکە تاقی بکەینەوە}.هەر سێ پیاوەکە دانیشتن و قاچ و باسکیان لەدەوری یەکتر ئاڵاند و چوونە خوارێ.زۆر بەخێرایی دەهاتنە خوارێ وەکو ئەوەی بفڕن.لەدواییدالەخوارەوە لای تۆپەڵە



بەفرێکی زۆر گەورە گیرسانەوە،بەخێرایی نزیکەی میلێک لە دەقیقەیەکدا هاتنە خوارێ.هەستانەوە و تەوقەیان لەگەڵ یەکتر کرد.

ئینجا کەوتنە ڕۆیشتن .لەکۆتاییدا وێستگەی ڕاوکردنی نەهەنگیان لەو خوارەوە بینی،ئەمە یەکەمین بینینی شارستانی بوو لە ماوەی نزیکەی هەژدە مانگی ڕابردوودا.بەخۆشییەکەوە تەماشای یەکتریان کرد و دیسانەوە تەوقەیان لەگەڵ یەکتردا کردەوە.

کاتێک گەشیتنە وێستگەی ڕاوکردنی نەهەنگ، یەکەمجار دوو مێردمنداڵ بینییانیان و ڕایان کرد.سێ پیاوەکە لە دیمەنێکی زۆر تۆقێنەردا بوون. قژ و ڕیشیان ئاڵۆز و پیس بوون.دەموچاویان یان ڕەش بوو بەهۆی دوکەڵەوە یان سپییەکی ڕەنگی مردوو لێنیشتوو بوو بەهۆی کرێوەوە.جلوبەرگیان لەت و پەت ببوو.







پیاوەکان هاتنە ماڵی بەڕێوەبەری وێستگەکە .((شاکلێتۆن)) پێشتر بینیبووی،بەڵام بەڕێوەبەر نەیناسییەوە.
بەڕێوەبەرەکە پرسی((تۆ کێی؟))
وەڵامی داوە((من ناوم شاکلێتۆتە)).
بەڕێوەبەر خێرا هەر سێ پیاوەکەی بردە ژوورەوەو دوشی گەرمیان گرت و جلی وشک و خواردنی گەرمیان پێدان.پاشان خۆی وهاوڕێکانی گوێیان گرت لە چیرۆکی ((شاکلێتۆن)) کەخۆی بۆی دەگێڕانەوە.



((7))
فریاکەوتن
((شاکلێتۆن)) هیچ کاتی بەفیڕۆ نەدەدا .زۆر نیگەران بوو سەبارەت بە دەستەکەی ،ئەو نەیتوانی پشوو بدات.دەبوایە بگەڕێتەوە بۆ لایان.ئەو شەوە بەڕێوەبەری وێستگەکە پاپۆڕێکی ڕاوی نارد بۆ ئەو سێ کەسەی کە لە لایەکەی تری دورگەکە بوون.هەر کەئەوان سەلامەت بوون،سەرۆک کەوتە ئامادەکردنی فریاگوزاری نەفەرەکانی تری دەستەکەی.
((شاکلێتۆن)) کەشتییەکی وەرگرت و کەوتە ڕێ بەرەو ((دورگەی ئەلەفانت)) بەڵام بەهۆی ئەستووری بەفرەکەوە وەستا.دەبوایە بسوڕێتەوە و بگەڕێتەوە.
دیسان و دیسان و دیسانەوە ((شاکلێتۆن))هەوڵی دا بگاتەوە بە دەستەکەی.لەدوا هەوڵدا توانی بەنێو بەفرەکەدا بڕوا.ئەوە چوارەم مانگە جێی هێشتوون.بەڵام پیاوەکان هەرگیز بێ هیوا نەبوون،چونکە بڕوایان بە سەرۆکەکەیان







هەبوو.دڵنیا بوون لەوەی ڕزگاریان دەکات.هەموو ڕۆژێک کەلوپەلەکانیان دەپێچاوەو خۆیان ئامادە دەکرد بۆ هاتنی ئەو.

لە 30 ی ئابی 1916 دا یەکێکیان گریا {ئەوە پاپۆڕە}، گشت پیاوەکان بەرەو کەنار ڕایان کرد.لەدوورەوە پاپۆڕێکی ڕەشیان بینی.هەر هەموویان کەوتنە دەست ڕاوەشاندن و هاوارکردن.

بەلەمێکی بچووک لە پاپۆڕەکەوە دابەزێندرا.بەهێواشی نزیک دەکەوتەوە.پیاوی بەردەم کەوانەی بەلەمەکە ((شاکلێتۆن))بوو.هەموو بەدەنگی بەرز هاواریان کرد. تەنانەت پێش ئەوەی بگاتە کەنار ((شاکلێتۆن)) کەوتە ژماردنی پیاوەکان.دەموچاوی لەترسانا خۆڵەمێشی داگەڕابوو.چەندیان زیندوون لەماوەی ئەو چەند مانگە ناخۆشەی سەر((دورگەی ئەلەفانت))؟لەپێناو ئەوان دەبوایە هەشت سەد میلی باشوری ئەو ئۆقیانوسە دڕە بەو بەلەمە



بچووکە ببڕێت .لەپێناو ئەوان دەبوایە ئەو چیا سەهۆڵبەندە وئەو ڕوبارە سەهۆڵییە ببڕێت و بگات بە وێستگەی ڕاوە نەهەنگ.لەپێناو ئەوان دەبوایە چەند مانگ هەڵ بدات بۆ شکاندن و ڕۆیشتن بە دەوری ((دورگەی ئەلەفانت)).

((شاکلێتۆن)) هاواری کرد{هەمووتان سەلامەتن؟}

پیاوەکان وەڵامیان داوەو لەگەڵ وەڵامی پیاوەکاندا دەموچاوی((شاکلێتۆن))گەش بۆوە {هەموو باشین...هەموو سەلامەتین}.

تەواو

2005-04-09

ڤانکۆڤەر/کەنەدا







سەرچاوە/

ICE WRECK

By Lucille Recht Penner

Illustrated by David Lafleur

A GOLDEN BOOK – New York

2001



## ئێڵقز..ئەو کەڵەشێرەی ئەڕوات بۆ بەهەشت



نوسینی/دەنیز کازێت

(1)

ئێڵقز بزر بوو

ئێڵقز چووە سەر لێواری سەربانەکە.ئێڵقز
کەڵەشێرێکی زۆر فیزن بوو
فیزی بەوە لێدەدا کە زۆر جوانە
فیزی بەوە لێدەداکە خەڵکێکی زۆر خۆشیان
دەوێن
فیزی بەوە لێدەدا کە جیهان لەخەو
هەڵدەستێنێت
ئێڵقز چاوەڕوان بوو
پاشان لەلای ڕۆژهەڵاتەوە تاڵە تیشکێکی باریک
دیار بوو
کاتی ئەوە بوو کە خۆر هەڵبێت
کاتی قوقاندن بوو
ئێڵقز هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا
لەناکاودا مێشوولەیەک فڕییە نێو دەمیەوە.
((ئێع)) هێڵنجی هاتەوە
خۆرەکە دەستی بە هەڵهاتن کرد



((ئێع! ئێع!))
خۆرەکە زیاتر هەڵهات
((ئێع! ئێع! ئێع!))
ئێڵقز مێشوولەکەی قووت دا
هێڵنجی هاتەوە
خۆرەکەی بینی لە ئاسمانی بەیانیدا
ئێڵقز ئاژەڵەکانی کێڵگەکەی بینی دەڕۆیشتن
بەدەم گلەیی کردنەوە ((مەحاڵە))
بەڵام ئەوە وا بوو
خۆر بەبێ ئەو هەڵهات
ئێڵقز لەهۆش خۆی چوو.







**((2))**

**ئێڵقز دۆزرایەوە**

**ویڵی و ڕۆکی بچکۆلانە گوێیان لە مریشکەکان گرتبوو**

**ویڵییە بچکۆلە وتی((باشە ئێڵقز دیار نییە))**

**دانیاڵە وتی((وایە،تکایە یارمەتیمان بدەن بۆ دۆزینەوەی ئێڵقز.**

**هەموو ڕۆژەکە دیار نەبووە))**

**جینا وتی((شتێک ڕووی داوە ))((ئێڵقز هەرگیز بۆ نان خواردنی بەیانیان درەنگ نەکەوتوە))**

**لیا ش بۆی زیاد کرد((نان خواردنی نیوەڕۆ))ش.**

**ویڵییە بچکۆلە پرسی((دواجار کەی بوو بینیت ؟))**

**دانیاڵە وتی((ئەم بەیانییە بوو کاتێک کە چووە دەرەوە بۆ ئەوەی خۆر هەڵبێنێت))**

**ویڵییە بچکۆلەکە تەماشایەکی ڕۆکی کرد و ئاماژەی کردە سەر بان**



**وتی((سەیرێکی سەربانەکە بکەن))**

**ڕۆکی شانێکی بادا ((تۆ فەرمان دەدەی))**

**ڕۆکی بەپەیژەکە چووە سەر بانەکە و ڕوانیە دەوروبەر.**

**بینی ئێڵقز پێچەوانەی باپێوەرەکە لار بۆتەوە.**

**بەهێمنیەوە دەیمنگاند ((لەوانەیە بیم بە مانگا ))**

**ڕۆکی هاواری کرد((ئەوەتا لێرەیە))**

**((خۆر بەبێ من هەڵهات)) ئێڵقز هەر منگە منگی بوو((من ئیتر بەکەڵکی هیچ نایەم))**

**ویڵییە بچکۆلەکە قیژاندی((ئایا زیندووە؟))**

**ڕۆکی وتی((نیوە مردوو بووە))**







**((3))**

**بەهەشت**

**ڕۆکی ئێڵڤزی هەڵگرتەوە و بردیەوە بەرەو کولانەکە**

**ئێڵڤز وتی((خۆر بەبێ من هەڵهات))**

**ویڵییە بچکۆلانەکە وتی((لەسەر جێگاکە درێژی بکە))**

**چاوەکانی ئێڵڤز ڕەشکە و پێشکەیان دەکرد**

**ئێڵڤز بە لاوازییەکەوە پرسی((ئەمە بەهەشتە؟))**

**((هەر ئەڵێی کولانەی مریشکە))**

**ویڵییە بچکۆلە وتی((ئەمە کولانەی مریشکە))**

**((کولانە مریشکەکەی تۆیە))**

**ئێڵڤز پرسی ((من نەمردووم؟))**

**ڕۆکی وتی ((نا جارێ))**

**ئێڵڤز بەهەناسە هەڵکێشانەوە((خۆزگە وانەبوایە))**

**((ژیان بەکەڵکی چی دێت ئەگەر ئیتر کەڵەشێر نەبیت))**

**ویڵییە بچکۆلەکە وتی((ئێڵڤز تۆ ئێستاش کەڵەشێری))**



**هەموو کەڵەشێرەکان دەبێت ئیشی خۆیان ئەنجام بدەن**

**خۆر زۆر قورس و گەورەیە.لەکەڵەشێرێک زیاتری پێویستە بۆ ئەوەی هەڵبێت.**

**ئێڵڤز وتی((من خێرا دەڕۆم))**

**چووە دەرەوە بۆ لای مریشکەکان**

**ئێڵڤز بە چرپەیەکەوە((ماڵئاوا هاوڕێیان)).**

**((4))**

**ئێڵڤز ڕەنگی هەڵدەبزرکێت**

**ویڵییە بچکۆلە تەماشایەکی ئێڵڤزی کردو وتی((متمانەکەی جارانی نەماوە)).**

**لیا وتی((گاڵە گاڵ؟)) ((گاڵەگاڵەکەی نەماوە))**

**ویڵییە بچکۆلە وتی((متمانەی نەماوە متمانە!))**







ئێلڤز ڕاست بۆوەو وتی((قاز؟)) ئیشەکەی من ئەدەن بە قاز؟))
جینا وتی((قاز ناتوانێت بقوقێنێت))
دانیاڵە وتی((جەسوری .بڕوا و متمانە بوون بە خۆ))
ئێلڤز بە زەحمەت خۆی گەیاندەوە سەر جێگاکە.
بەمنگەمنگەوە وتی((وا دونیا تاریکتر دەبێت))
ڕۆکی گڵۆپەکەی داگیرساند.
ئێلڤز هەناسەیەکی هەڵکێشا((ئۆە بزانە خۆر دیسانەوە بەبێ من هەڵهات!))
ڕۆکی گڵۆپەکانی کوژاندەوە.
ژوورەکە تاریک بوو.
ئێلڤز هەستایەوە وتی ((بوەوە شەو؟))
ڕۆکی گڵۆپەکانی داگیرساندەوە.
ئێلڤز بە خەمبارییەکەوە((ئۆ خوایە،لەناو جێگەدا شەو و ڕۆژ بۆ ئاوا بەخێرایی دێن و دەڕۆن؟))
ویلّیە بچکۆلە منگاندی((ئمممم، من بیرۆکەیەکم هەیە .لەدەرەوە چاوەڕوانم بن))



((5))

متمانە

پاش ئەوەی ویلّیە بچکۆلە پیلانەکەی بە هەموان ڕاگەیاند بۆ یارمەتی دانی ئێلڤز،
لە حەوشەی مریشکەکان کۆبوونەوە.
((دانیاڵە تۆ لایتی دەستییەکەت پێیە؟))







دانیاڵە وتی((بەڵێ پێمە))
ڕۆکی وتی((ئەوەش پەیژەکەیە))
ویلێیە بچکۆلە پەیژەکەی لەقاند و وتی ((پێ ناچێت مەتین بێت))
ڕۆکی وتی((لە ناو کادینەکە دۆزیمەوە))
ویلێیە بچکۆلە وتی((ئیشی پێ دەکرێت،پێش بەیانیە و کاتمان زۆر بەدەستەوە نیە))
ئایا هەموو لە پیلانەکە تێگەیشتووین؟))
لیا وتی((گاڵە گاڵەکە بۆ ئێلڤز دەگەڕێنینەوە))
دانیاڵە وتی((متمانە))
جینا وتی((لۆری؟ من نەمزانی ئێلڤز توانای لێخورینی هەبێت))
دانیاڵە وتی((متمانە...متمانە))
ویلێیە بچکۆلە وتی((تکایە هاوڕێیان جارێکی تریش ئەیلێمەوە
ئەمەوێت تۆ لەسەر پەیژەکە لەبەرامبەر پەنجەرەی کولانەکە بوەستی
کاتێک ئێلڤز لەخەو هەڵدەستێت
لایتەکە پێبکە



ئەویش وا دەزانێت ئەوە خۆرە
هەر کەدانیشت تۆش نزمی بکەرەوە))
جینا وتی((من تێنەگەیشتم))
لیاش چاوەکانی دەسوڕاند((هەوڵ دەدەین گاڵەگاڵ بۆ ئێلڤز بگێڕینەوە))
دانیاڵە وتی((متمانە))
جیناش وتی(( من ئێستاکەش تێنەگەیشتم))

((6))
خۆر سەردانی ئێلڤز دەکات
ڕۆکی و ویلێیە بچکۆلە چوونەوە نێو کولانەکە.
ئێلڤز دەیپرخاند
لایتەکە لەدیوی دەرەوەی پەنجەرەکە پێ بوو.
ویلێیە بچکۆلە وتی(( وا خۆر هەڵدێت))







**ئێلڤز چاوەکانی کردەوە و هەستا**

**لایتەکە گەشتر بوو**

**ئێلڤز پرسی((ئەوەت بینی؟))**

**هەستایە سەر پێ و لایتەکەش بەرز بۆوە.**

**ئێلڤز لەسەر جێگاکە وەستابوو و وتی((خۆر شوێن پێم هەڵدەگرێت))**

**لایتەکە بەرزتر بۆوەو دەستی کرد بە هەڵبەزە و دابەزە و بۆ پێش و پاش.**

**ئێلڤز پرسی ((ئەوە خۆرەکە چییەتی؟))**

**یەکێک هاواری کرد((فریام کەون!))**

**شریقەیەکی گەورە هات و شتێک شکا.**

**لایتەکە لەناکاو بەرپەنجەرەکە کەوت و ون بوو.**



**((7))**

**خۆر دەڕواتە دەرێ**

**ئێلڤز بەپەلەچوو بەرەو پەنجەرەکە**

**وتی((خۆرەکە لەئاسماتەوە کەوتە خوارەوە))**

**ویلّییە بچکۆلە سەری خۆی خوراندو وتی((ئێ تەماشا خۆرەکە هەرچەند هەوڵی دا نەیتوانی بەبێ هەوڵی تۆ لەئاسمان بمێنێتەوە ))**

**ئێلڤزیش سەری دەلەقاند.**

**ئێلڤز وتی((گوێم لێ بوو،گوێم لێبوو خۆرەکە هاواری کرد ((فریام کەون!))**

**دانیاڵە بەلارەلار هاتە نێو کولانەکەوە.**

**لیا و جیناش لەدوای ئەوەوە دەشەلین.**

**ئێلڤز تەماشای مریشکەکانی کرد و وتی((خۆر هاواری بۆ کردم))**

**ویلّییە بچکۆلەکە وتی((ئێلڤز تەماشا،تەنها یەک شت هەیە یارمەتی خۆرەکە بدات.**

**ئەویش قوقاندنی یەکێکی گەنج و بەهێز و جوان و...))**







ئێلڤز باڵەکانی کردەوەو وتی((ئەزانم باسی کێ دەکەی))
((ئەوە منم وا نیە؟))
ویلّیە بچکۆلە سەرێکی لەقاند.
ئێلڤزیش وتی((زۆر باشە))،دەستی بۆ مریشکەکان درێژ کرد((لەبەر خاتری ئەوان دەیکەم))

((8))
ئێلڤز کارەکە ئەنجام دەدات
هەموو سەرکەوتنە سەر بان و



دانیاڵە ئێلڤزی برد بۆ قەراغ گوێسوانەکە
ئینجا وتی((دەتوانی ئەنجامی بدەی))
ئێلڤزیش تەماشای ئەوبەر گردە تاریکەکانی کرد.
پاشان لەلای خۆرهەڵاتەوە تاڵە تیشکێک دیار بوو.
کاتی بوو
ئێلڤز هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا .
لەناکاودا قالوچەیەکی گەورە فڕییە ناو دەمییەوە.
((ئێع!)) ئێلڤز هێڵنجی هاتەوە((ئێع! ئێع!))
ویلّیە بچکۆلە هاواری کرد((قووق))
ڕۆکی دەنگی بەرز کردەوە((قووق))
تیشک دەستی کرد بە بڵاوبوونەوە بەنێو ئاسماندا.
دانیاڵە باڵەکانی بەدەوری ئێلڤز دا لوول دا و ئینجا توند گوشی.
قالۆچەکە لەدەمی ئێلڤزەوە دەرپەڕییە دەرەوە و ئێلڤز هێڵنجی هاتەوە.
ئێلڤز قوقاندی







خۆرەکەش هەڵهات
دووبارە قوقاندی
خۆرەکەش زیاتر بەرزبۆوە.
ئێڵڤز قوقاندی هەتا خۆرەکەگەیشتە پشت
داربەڕووەکەی سەر گردەکە.
ئێڵڤز وتی((من باشم یان نا؟))
کەڵەشێرەکان هاتنە خوارەوە و سێ مریشکەکەش
لەسەر بانەکە دانیشتن و
سەیری کێڵگەکەی خوارەوەیان دەکرد.
دانیاڵە وتی((باشە ...کارەکەمان ئەنجام دا))
لیا وتی((گاڵەگاڵی ئێڵڤزمان دۆزییەوە.
دانیاڵە وتی((متمانە)) ((متمانەی ئێڵڤزمان
دۆزییەوە!))
ئەم کارەمان ئەنجام دا
جینا پرسی((لەکوێ؟)).

2005–04–16
ڤانکۆڤەر/کەنەدا



سەرچاوە/
Elvis the Rooster
Almost Goes to Heaven

Den s Cazet
Harper Collins publishers
First Edition 2003 USA







## بایسکیل و کەروێشکی شین



نوسینی/کریس ۆرمێڵ



ڕۆژێکیان کەروێشکێکی شین بە شوێن سەرکەشیدا دەگەڕا لە بری ئەوەی بڕوات بەرەو شوێنی مەبەست........ملی بە بەردێکی گەورەوە نا و تایەی بایسکیلەکەی دەرچوو.کەروێشکە شینەکە بە قووندا کەوت و بەڵام زوو هەستایەوە و کەوتە گەڕان بە شوێن تایەی بایسکیلەکەی کە بە جادەکەدا غلۆر ببوەوە خوارێ.کەروێشکەکە زۆر دوور نەکەوتەوە چاوی بە سمۆرەیەک کەوت کە خەریکی دار کۆکردنەوە بوو.

کەروێشکەکە وتی : سڵاو سمۆرە .ئەوە قۆمەتێکی باشی داری سووتان دروست کردووە

سمۆرەکە بە توڕەییەوە وتی "داری سووتان!".من خەریکی دروستکردنی ماڵێکی خنجیلانە بووم کاتێک گڤەیەکی خێرا هات و منیش ئەم دارە شکاوانە کۆدەکەمەوە.

کەروێشکە شینەکە وتی: ئۆە،ئازیزم پێم سەیرە کە ئەم گڤەیە .......

نازانم ،بەڵام گڤەکە هەرچییەک بوبێت ئاوا بەم ئاراستەیە ڕۆیشت (سمۆرەکە پەنجەی بەرەو لای خوارەوەی جادەکە درێژ دەکرد) و من دوای دەکەوم.

لای خوارەوەی جادەکە توشیان بوو بە قوربەشەیەکەوە کە لە نێو چاڵێکی قوڕاوی دانیشتبوو.

کەروێشکە شینەکە وتی: سڵاو قوربەشە،

قوڕبەشە بە بۆڵە بۆڵێکەوە وتی: ڕۆژێکی خۆشە بۆ خۆ لە قوڕ هەڵکێشان ، وا نیە؟من بیرم لەوە دەکردەوە ڕۆژی خۆش چی کە بکەویتە ناو ئەم چاڵە پیسەوە کاتێک کە شلپەیان لێوە هەستاندم

سمۆرەکە پێشنیاریانە وتی: لەوانەیە ئەو گڤەیە تۆی فرێدابێتە نێو ئەم چاڵەوە

قوڕبەشەکە وتی:هەرچییەک بوبێت لەسەر بایسکیل بوو .(قوربەشەکە ئاماژەی بۆ تایەیەکی قوڕاوی بایسکیلێک کرد) و من دوای دەکەوم.

"لەسەر بایسکیل بوو" کەروێشکە شینەکە بە خۆی گوت"ئۆە خوایە"



تۆزێک لە خوارتری جادەکەوە چاویان بە کیسەڵێک کەوت کەلەسەر پشت ڕاکشابوو.

کەروێشکە شینەکە و سمۆرەکە و قوڕبەشەکە وتیان:سڵاو کیسەڵ ، هەوایەکی خۆشە بۆ خۆهەڵخستن لەبەر خۆر

کیسەڵەکە وتی: خۆ هەڵخستن لەبەر خۆر ، وا نیە؟ من وام زانی دونیا کۆتای هات _ ووژەیەک و دەنگێکی گەورە هەموو شتێکی قڵپ کردەوە و خولاندەوە...دەڵێم دەتوانن بمخەنەوە سەر دەم؟

کیسەڵەکە زۆر سوپاسگوزار بوو.

سمۆرەکە وتی: دەبێت گڤەیەک بوبێت

قوڕبەشەکەش بۆی زیاد کرد: لەسەر بایسکسل بوو

کەروێشکە شینەکەش بە ئومێد خوازییەوە وتی:لەوانەیە وا نەبێت،دەشێت بوومەلەرزە بووبێت.

"بوومەلەرزە سواری بایسکسل نابێت" قوڕبەشەکە بە ئاماژەکردن بۆ تایە قوڕاوییەکەوە وتی"دەی







ئەگەر ئێمە شوێن تایەکە هەڵگرین ،زوو یان درەنگ ئەو تاوانبارە دەدۆزینەوە.
وە دۆزیشیانەوە. وەختێک کەوتنە گەڕان بە شوێن تایە بزربووەکەوە بازنەیەکی گەورەی دەوری بەردێکی گەورەیان بینی کە کەروێشکە شینەکە خۆی لێدابوو و لەوێدا وەستان
کەروێشکە شینەکە لەناکاودا وتی: بۆ بایسکیلەکەم لێرەیە؟
سمۆرەکە و کیسەڵەکە وتیان: بایسکیلی تۆ؟
قوڕبەشەکە وتی"کەواتە دەبێت ئەو تایە قوڕاوییە هی بایسکیلەکەی تۆ بێت"
کەروێشکە شینەکە وتی"بۆ وابزانم هی بایسکیلەکەی منە و کەوتە چاککردنەوەی.دەبینی لێبۆتەوە و غلۆر بۆتەوە و ...ڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕ"
ئینجا وەستا بۆ سمۆرە و قوڕبەشە و کیسەڵ کە بە ووردی دەیانڕوانی و بە گریانەوە وتیان"کەواتە تۆ ئەو بایسکیل سوارە هەڵەشەیەی"
بەڵام پێش ئەوەی بتوانن بیگرن ،بایسکیل سوارە هەڵەشەکە خۆی هەڵدایە سەر بایسکیلەکەی و بە



جادەکەدا غلۆر بۆوە و تەنها شوێن تایەی قوڕاوی بایسکیلەکەی لە دوای خۆیەوە بەجێهێشت.

سەرچاوە
Blue Rabbit and the runway wheel
Chris Wormell
Printed in Hong Kong in 1999







## کۆلگە بچکۆلە





**نوسینی/کیم لویس**

**ئەمڕۆ لە کێڵگەکەی کەیتی**
**گۆلکێکی بچکۆلانە لە دایک بوو**
**گۆلکە بچکۆلانەکە هەستایە سەر پێ**
**یەکەم جار بە لارەلار هەنگاوی نا**
**گۆلکەکە هاتە لای کەیتی.**
**هەڵمی هەناسەی گۆلکەکە**
**لەسەر ڕوومەتی کەیتی گەرم بوو**
**کەیتی بە وریاییەوە دەستی پێدا هێنا**
**دەستی بە لوتی گۆلکەکەدا هێنا**
**کەیتی بەنەرمی لە دەموچاوی گۆلکەکەیدا و بەچرپەوە وتی:**
**"سڵاو، گۆلکە بچکۆلەکە"**
**"مۆۆۆۆۆۆ!"مانگاکە بانگی گۆلکە بچکۆلەکەی کرد**
**گۆلکە بچکۆلەکە چووەوە لای دایکی و دەستی کرد بە شیر خواردن.**

**کەیتیش بە باوکی وت:"بابە گۆلکە بچکۆلەکە پەنجەمی مژی "**
**باوکیشی باوەشێکی گەرمی بە کەیتیدا کرد.**

**سەرچاوە**

LITTLE CALF
Kim Lewis
Printed in Hong Kong 2000



**خۆشم ئەوێی ، بچکۆلەکەم**

**نوسینی/نانسی تافوری**

**لە ناوجەرگەی دارستانێکی کەنار ڕوبارێکدا**
**ئاسکۆڵەیەک لە دایکی دەپرسێت :**
**"دایکە تۆ منت خۆش دەوێت؟"**
**دایکی ئاسکۆڵەکەش دەڵێت:**
**" بەڵێ بچکۆلانەکەم**
**تۆم خۆش دەوێت وەک چۆن ڕوبار تۆی خۆش دەوێت و**
**گۆرانیت بۆ دەڵێت و**
**ئاوی سازگارت دەداتێ بۆ خواردنەوە**
**خۆشم دەوێیت وەک چۆن ڕوبار تۆی خۆش دەوێت**
**بۆ هەمیشە و هەتا هەتا ."**

**لەناو جەرگەی دارستانێکدا و**







له کەنار گۆمێکی قەوزەداردا
بەچکە قازێک لە دایکی پرسی :
" دایکە تۆ منت خۆش دەوێت؟"
دایکی قازەکەش دەڵێت:
"بەڵێ بچکۆلانەکەم
خۆشم دەویێت  وەک چۆن قەوزە تۆی خۆش دەوێت
پان و هێمن لەژێر تۆدا
خواردن و شوێنی مەلەت پێدەبەخشێت
خۆشم دەویێت  وەک قەوزە تۆی خۆش دەویێت
بۆ هەمیشە و هەتا هەتا."

لەناو جەرگەی دارستانێکدا و
لە نێو کونە چاڵێکی خۆڵاویدا
بەچکە کەروێشکێک لە دایکی دەپرسێت:
" دایکە تۆ منت خۆش دەوێت؟"
دایکی کەروێشکەکەش دەڵێت:
"بەڵێ بچکۆلانەکەم



تۆم خۆش دەوێت هەر وەک چۆن خاک تۆی خۆش دەوێت
گەرمی و خۆشیت پێدەبەخشێت
جێی خەوتنی گەرمت بۆ فەراهەم دەکات
تۆم خۆش دەوێت هەر وەک چۆن خاک تۆی خۆش دەوێت
بۆ هەمیشە و هەتا هەتا."

لەناو جەرکەی دارستانێکدا و
لە ناو مێرگێکی پڕ لە گژوگیادا
مشکێکی بچکۆلانە لە دایکی دەپرسێت:
" دایکە تۆ منت خۆش دەوێت؟"
دایکی مشکە بچکۆلانەکەش دەڵێت:
"بەڵێ بچکۆلانەکەم
تۆم خۆش دەوێت  وەک چۆن ڕوەکی شێلم تۆی خۆش دەوێت
میهرەبانانە بەسەر سەرتەوە دەشنێتەوە و
خواردنت پێدەبەخشێت و دەتپارێزێت







تۆم خۆش دەوێت  وەک چۆن ڕوەکی شێلم تۆی
خۆش دەوێت
بۆ هەمیشە و هەتا هەتا."

لەناو جەرگەی دارستانێکدا و
لە نێو ئەشکەوتێکی تاریکی شاخێکدا
بەچکە ورچێک لە دایکی دەپرسێت:
" دایکە تۆ منت خۆش دەوێت؟"
دایکی ورچەکەش دەڵێت:
"بەڵێ بچکۆلانەکەم
خۆشم دەوێیت هەر وەک چۆن شاخ تۆی خۆش
دەوێت
بەرگریت لێدەکات و
لە بەفر و باران  دەتپارێزێت
خۆشم دەوێیت هەر وەک چۆن شاخ تۆی خۆش
دەوێت
بۆ هەمیشە و هەتا هەتا."

لە نێو جەرگەی دارستانێکدا و



لە نێو دار بەڕوویەکی کلۆردا
کوندەپەپویەکی بچکۆلانە لە دایکی دەپرسێت:
"دایکە تۆ منت خۆش دەوێت؟"
دایکی کوندەپەپوەکەش دەڵێت:
" بەڵێ بچکۆلانەکەم
خۆشم دەوێیت  وەک چۆن دار بەڕوو تۆی خۆش
دەوێت
بەرز و بڵند
بواری بینینی دەروبەرت پێدەبەخشێت
خۆشم دەوێیت  وەک چۆن دار بەڕوو تۆی خۆش
دەوێت
بۆ هەمیشە و هەتا هەتا."

لە نێو جەرگەی دارستانێکدا و
لە نێو خانوویەکی گەورەدا
منداڵێک لە دایکی دەپرسێت:
"دایکە تۆ منت خۆش دەوێت؟"
دایکەش لەوەڵامدا دەڵێت:
"بەڵێ ڕۆڵە بچکۆلەکەم







خۆشم دەوێیت  وەک چۆن ئەستێرە تۆی خۆش دەوێت
وەفادارانە و بەسەر سەرتا دەدرەوشێتەوە
خۆشی و ئاشتی و سەرسوڕمانت پێدەبەخشێت
خۆشن دەوێیت  وەک چۆن ئەستێرە تۆش خۆش دەوێت
بۆ هەمیشە و هەتا هەتا."

سەرچاوە

LITTLE ONE،I LOVE YOU

Nancy Tafuri

Printed in Singapore    1998









**ژیاننامەی شاعیر**

*** عەبدوڵا سلێمان((مەشخەڵ)) لە سالی 1964 لە شاری کەرکوک لە دایک بووە.**
*** خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی وپاشان پەیمانگای تەکنەلۆجیای لە ساڵی 1986 هەر لە کەرکوک تەواو کردووە.**

*** لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردووەوە شیعر دەنوسێ و لە زۆربەی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردستان و دەرەوەی کوردستان بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.**



*** بەشداری چەندین کۆڕی شیعری لە شارەکانی کەرکوک و هەولێر کردووە.**
*** سەرنوسەر و ئەندامی دەستەی نووسەرانی چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەی لە ئەستۆ گرتووە، لەوانە ((گۆڤاری ڕابەر، ڕۆژنامەی دەنگی بێکاران، گۆڤاری هانا)).**
*** ئێستاش چەند ساڵێکە لە وڵاتی کەنەدا دەژێت.**

**لە بڵاو کراوەکانی شاعیر:-**
*** چرای شۆڕش شیعر (دەستنووس)** 1989
*** دیوارەکان ئەڕوخێنین وەرگێڕانی بەشێک لە شیعرەکانی برێخت لە ژێر ناوی(دلاوەر حوسێن)(دەستنووس)** 1990
*** چاوم لێیە شیعر** 1992
*** چەند گۆرانی یەک لە جەنگەڵستانی ژیانەوە شیعر**1992
*** نامیلکەی ( دەربارەی قانونی جەمعیاتی حکومەتی هەرێم )** 1993







* **نامیلکەی (با ئاوڕێک بۆ دواوە تەکانێک بێت بۆ پێشەوە) لەژێر ناوی(مارف عوسمان)** 1993
* **ڕژانی دڵۆپەکانی مەنفا شیعر** 2005
* **بیابانێکی پڕ لە دوکەڵ وەرگێڕان** 2006
* **چەندین ووتاری ڕەخنەیی ئەدەبی و سیاسی و جەماوەری نوسیوە و بڵاو کردۆتەوە.**

**تێبینی///**

**سەرجەم بەرهەمە دەستنووسەکانی شاعیر فەوتاون و لە بەردەستدا نین، تەنها ئەو بەرهەمانەی کە لە دوای ڕاپەرینەوە نوسراون**







ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی لقی کەرکووکی یەکێتی نووسەرانی کورد پاش کۆنفرانسی ئازادی بەچاپی گەیاندوون جگە لە گۆڤاری گزنگ کە بەردەوام مانگانە دەردەچێت.

1. چیرۆکستان دەق و رەخنە حەمە کەریم عارف
2. کرکوک والتگهير العرقی دیکۆمێنت و: رەعد بابان
3. مانیفێستەکانی پووچی هۆزان مەهدی زریان
4. شیعری هەڵبژاردە بۆ منداڵ و گەورە هۆزان لەتیف هەڵمەت
5. بەرەو شێت بوون هۆزان عومەر سەیدە
6. دڵۆپە هۆزان یوسف لەتیف
7. ماچ کۆمەڵە دەق بەکر دەروێش
8. چاوبڕکێی سەر زورگەکان چیرۆک حەمە سەعید زەنگنە



9. داوەتی کۆچەریان چیرۆک حەمە کەریم عارف
10. ناسنامەی دەق رەخنە و لیکۆڵینەوە د. فوئاد رەشید
11. شرۆڤەیەک لە بازنەدا گوتارو رەخنە سەردار جاف
12. تەکنیکی گێڕانەوە لە چیرۆکەکانی مارف بەرزنجیدا لێکۆڵینەوە شوکریە رەسوڵ
13. گەڕانەوە بۆ حەیفا چیرۆکی وەرگێردراو ئەحمەد عارف
14. سۆسیۆلۆژیای شیعری کوردی لێکۆڵینەوە د. ئازاد عەبدولواحێد کەریم
15. لە هەردەکانی کوردستانەوە بەرەو بیابانی عەرەب رۆمان جەلیل محەمەد شەریف
16. بانێژەی خەمەکانی شارەکەم هۆزان بورهان بەرزنجی
17. عەورەتی گەڵا هۆزان سیروان ناشاد
18. هونەری رۆژنامەنووسی لە گۆڤاری نزاردا لێکۆڵینەوە شوان خورشید







19. ژوانی عەشقداری شانۆگەری وریا شەهاب
20. ئۆپەرێتەکانی هەزارەی سێیەم هۆزان بورهان ئەحمەد
21. ئێوارەیەک نایەمەوە هۆزان لەتیف فاتیح فەرەج
22. سیفری ئاگر هۆزان کەریم دەشتی
23. لە روانگەی زمانناسییەوە لێکۆڵینەوە و:د. ئازاد ئەمین باخەوان
24. گورگ چیرۆکی وەرگێڕدراو و: عەلی بەرزنجی
خالید – مەجید فەتحوڵڵا
25. زریوەی ئەستێرە دەسرازەی زامە هۆزان ستار ئەحمەد عەبدولڕەحمان
26. داستانا لێدانا گازخانا کەرکوک ل سالا 1969 داستان وەیڤی حسن ردێنی
27. دار زەیتوون چیرۆک فەیسەڵ تاهیر هەمەوەندی



28. یاریزانی شەترەنج رۆمان و: محەمەد سابیر مەحموود
29. ئەو وشانەی دڕ بە تاریکە شەو دەدەن وتار لەتیف هەڵمەت
30. یوونس ئەمرە خۆشەویستیی خاک و مرۆ هۆزان و: ئەحمەد تاقانە
31. کوردو ڕەگەزی ئاری لێکۆڵینەوە مەلا جەمیل رۆژبەیانی
32. هجره الگائر الازرق شعر عباس عسکر
33. دەروازەیەکی مێژوویی بۆ مافەکانی مرۆڤ لێکۆڵینەوە کامەران تاهیر
34. ئەشکەوتی خوێن رۆمان سالار ئیسماعیل سەمین
35. مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدەبی- رۆشنبیری ئەدەبیات ورۆشنبیری حەمە کەریم عارف
36. منداڵێک بووم لە کوردستان چیرۆک و: عومەر عەلی شەریف







37. خۆشنووسانی کورد خۆشنووسی عەبدولستار جەباری
38. بەرسیلە عیشقێ بۆ خودا شیعر ئاویزان نووری
39. مانگ شیعر و: هیمەت کاکەیی
40. چەمک و ستاتیکای شوێن لەئەدەبدا لێکۆڵینەوە سەباح ئیسماعیل
41. ئەرشیفەکانی فیراق شیعر شێخ سدیق
42. ئەو نامانەی بە فرمێسک نووسراون نامە ئا: لەتیف فاتیح فەرەج ئاکۆ محەمەد شوانی
43. هەقایەتی داپیرە چیرۆک بۆ منالان و: هێمن دەلۆیی
44. دەروازەیەکی مێژووییانە بۆ رووداوەکەی 1959 مێژوو سمکۆ بەهرۆز محەمەد
45. کورد لە سێبەری خیلافەتی عەرەبیدا لێکۆڵینەوە
46. زەمەنێک بۆ خەم شیعر دانا عەسکەر



47. گەلا رژاوەکان رۆمان و: عەلی بەرزنجی
48. کچەکانی حەوا چیرۆک سەبریە ئەحمەد حەمە (سەبا)
49. کرمەزاڵ شیعری بیانی و: یابر شاکر مەلوول
50. گێژاو چیرۆک موعتەسەم ساڵەیی
51. ئەفسونی ئاوێنە رەشەکە چیرۆک حەسەن نازدار
52. یارێکم هەیە لەخۆمدا شیعر عومەر عەبدول
53. هاوارێک ...هەر لە تەم ئەچێت شیعر گۆریان
54. شارێکی قاوەیی کۆمەلە چیرۆک و:عەبدولا مەحمود
55. کوردو چەند بابەتێکی مێژووی لێکۆڵینەوە هاشم عاسی کاکەیی
56. کەرکوک : شاری قەلاو ئاگرو خوێن لێکۆڵینەوە عەلی مەحمود محەمەد







57. گەشتێک لەنێوان مانگء دەریادا شانۆگەری د .عەبدولکەریم حاجی محەمەد
58. شەوە خوێناویەکەی ژوورسەری دایکم کورتە چیرۆک محەمەد حسێن
59. ئە پیری لێکۆڵینەوە د. ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید
60. مقام و مۆزیکی فۆلکلۆری کوردی سەلاح داودە وەک نموونەیەک لێکۆڵینەوە هەردەوێڵ کەکەیی
61. رۆبن هوود چیرۆک و: زنار محمد
62. دیوارێک و سێ نیگار هۆنراوە عەباس عەسکەر
63. جەنگ و نێوانەکان کۆمەڵە وتار سمکۆ محەمەد
64. پەرتەوازەکانی ئێرەو ئەوێکانی رەوان رۆمان عەبدولا سەراج



65. تەمەنی مرۆڤ چیرۆک سەلاح ساڵح مەجید
66. گوڵە مۆرەکان چیرۆک و: عەبدولا سلێمان





